# دیوان
# حضرت شیخ
# محمد عثمان سراج الدین
# نقشبندی

بدوزبان کردی وفارسی

آماده کردن

عبدالله مصطفی صالح (فنائی)

چاپ استانبول

برگ دوم

سنه ١٩٩٥ میلادي

# بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاسی بێ پایـان شایانی پە روە ردگارێکە کـە بە ویست و دە ستـە لاتی خۆی شتێکی بە ناوی عالە م واتە بێجگە لە خـوا لە نە بونی تە واوە وە هێناوە تە دی کە لە وە و پێش نە بۆنێکی لە گوڵزاری بوون بۆ چوبو ونە تامێکیشی لە باخچە ی خواناسی چێشتبـو. درود ورە حمە تی نە بڕاوە لە سە ر روحی پاکی ڕابە ری مرۆڤ یانـی حە زرە تی پێغـە مبـە ری خۆشـە ویست و ئال و بە یت و یارانی تا ڕۆژی دوایی دوبارە سـوپاس بۆ یە زدانی مـە زن کـە لە نـاو ئە م بونە وە ردا کۆمـە ڵی مـرۆڤی هە ڵبژارد بۆ ئاوە دان کـردنە وە و سە رپە رشتـی زە وی لە هە موو بـوارێکدا و لە ناو ئە وانیشـدا تاقمی پێـغـە مبـە رانی کـرد بە گە ورە و ڕابە ری رێگای خواناسی و یە کـتا پە رستی بۆ ئە وە ی هە م زاتی خـوا کە لە مە وبە ر نە ناسرا بو بناسرێ و هە م بە ندە کانیش ئە ڕکی بە ندە یی خۆیان بە جێ بهێنن بۆ ئە وە ی لە و ناز و نیـعـمـە تە بێ وێنە یە بێبە ش نە بن جـا چونکە دونیا وە ك کاروان سە رایە کی کاتی یە و هە تا هە تا یە بۆ کە س نابێ وە کو لە حە دیسا هاتووە (العلماء ورثة الانبياء) وە یا وە کو خوا ئە فە رموێ:

(ولتكن منكم امة يدعـون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهـون عن المنكر) لە ئوممە تی هە ر یە کێك لە و پێغە مبە رە گە ورانە بۆ ئە وە رێگـە ی خواناسی کوێر نە بێتە وە زانایانـی ئایینی بە جێگە داری ومیراتگری ئە وان لە ئو ممە تی هە مـوو پێغە مبە رێك هە ڵبـژار د بۆ بە ردە وامی زانیاری ئاشکراو نە هێنی کـە ئە م دوو زانیـاریە دوو شاباڵی سـە رە کین بۆ خـواناسی و سـە رە تای ئە وین و عە شـقی ڕاستی.

ڕاسته وخۆ یا نا ڕاسته وخۆ. جا هه ر ئه و سۆزی عه شقه ڕاسته بو پاڵینا به زۆر که سه وه تا له ئه نجامدا زۆر پیاوی بلیمه ت و لێهاتویان بۆ دین و دونیا لێ هه ڵکه وت و هه ر به بزوتنی ئه و هه ستی عه شق و ئه وینه وه خوێند نگه و کتێبخانه یه کی زۆر گه وره یان پێش که ش به مرۆڤایه تی کرد و له پاڵ ئه و ئه رك و خزمه ته پیرۆزه دا ناوی خۆشیان له کتێبخانه ی مێژودا بۆ هه تا دونیا ئه برێته وه تۆمار کرد. بێ گومان گه لی کوردیش وه کو هه موو گه لێکی تر له م بواره دا به شداری کردووه و بگره له زۆر باریشه وه ئه گه ر پێش که وتوتر نه بوبێ دوایش نه که وتووه به تایبه تی له م دوو سه ده ی دواییدا که حه زره تی مه ولانا خالیدی (ذي الجناحين قدس سره» ) وه کو هه تاوی نیوه ڕۆ له ئاسمانی ڕوندا له دوای گه ڕانه وه ی له ده هلی دووباره له کوردستان سه ری هه ڵدایه وه و سوپاس بۆ خوا پڕشنگی نوری ئیرشاد و به ره که تی ئه وزاته.

ڕۆژهه ڵات و ڕۆژئاوای گرته وه و له پاش کۆچ کردنی بۆ ووڵاتی شام چه ند خه لیفه ی به ناو بانگی له کوردستان به جێ هێشت به تایبه ت حه زره تی شێخ عوسمانی سیراجه دینی نه قشبه ندی ته وێڵه که سوپاس بۆ خوا له و کاته وه تا ئێستاش که ڕێکه وتی (٨-١-١٩٩٥) زاینی یه به وجودی پیرۆزی حه زره تی شێخ محمد عوسمان سیراجه دینی نه قشبه ندی دووهه م له بواری ئامۆژگاری و ڕێ نوێنی موسوڵمانان و چاودێری و خزمه تی مه لاوفه قێ و قوتابخانه ی ئاینی و بڵاوکردنه وه ی ڕاستی ئاینی پیرۆزی ئیسلام وه کو پێشو و بگره باشتریش هه ر به رده وامه و ئیرشادی حه زره تی پیر سوپاس بۆ خوا به هه موو لایه کـــا پڕشنگی زۆر شـــوێنی ڕۆژ هه ڵاتی ناوه ڕاست و ڕۆژ هه ڵات و

ڕۆژئاوای گرتۆته وه تائه توانم بڵێم دوای ئه و زاته بازنه ی ئیرشادی که سێکی تر وا گه وره و به ر بڵاو نه بووه ته نانـه ت ڕه گـی له مه کـکه ی موکه ڕِمه و مه دینه ی مونه ووه ره ش داکوتاوه وه له ڕوی ڕه وشت و خووه وه وه کو.

بـه رچـاو فـراوانی و مـیـهره بانی و میوانداری و غه ریب نه وازی و به خشنده یی و ئه ده ب دۆستی و هی تریش... زۆر باڵا ده ست و بێ هاوتایه وده ستی کـه سی پێ ناگا به ڵـکو خه ڵکی تر له هه موو بواریـّکدا ده بێ بێن له خزمـه تیدا که مـالی ئه ده ب وئه خلاق فێربن وه هه رشتێك کـه ئه مڕۆ له شوێنی تر ده ست ناکـه وێ لێره وه ری بگرن له بواری تـه وحیدو ئـه سراڕی خواناسیدا.

به هه رحاڵ ئه م باسه پێویستی به درێژه ی زۆره با لێره دا بوه ستێ به ڵام به هـه لیـشی ده زانم کـه مـێك مـێـژوی ژیانی خـاوه نی ئـه م دیـوانه بۆخوێنده وارانـی به ڕێز ڕون بکه مه وه حه زره تی شێخ له مانگی سـه فه ری ساڵی( ١٣١٤ ) کۆچی چاوی به دونیا هه ڵێناوه له دوای به سه ر چونی ماوه ی مناڵی هه ر له مه دره سه ی بیاره ده ستی کردووه بـه خوێندنی علومی دینی تا له کۆتاییدا له لای ما مۆستای بلیمه ت و پایه به رز و زانا جه نابی مامۆستا مه لا سید حسین تاهیر بوغی ئیجازه ی علمی زاهیری وه ر گرتووه و هه ر له وکاته دا به هه موو لێ بڕانێکه وه لـه خزمه ت باوکی دا حه زره تی شێخ «محمد علاء الدین قدس سره» ده ستی کـردووه به سه یر و سلوك و ئادابی ته ریقـه ی پیرۆزی نه قشبه ندی وئه وه ی پێویست بێ مورید بیکا ئه و به رامبه ر باوکی به جێ ی هێناوه و بۆ ته نیا یه ك ڕۆژیش کـه مته رخه می تێدا نه کـردووه تا ئه گاته پله و

پایه ی ئیرشاد و ئیجازه ی ئیرشاد و ته وه جوه و هه موو شتیکی پێ ئه دا.

به لام به شاهیدی پیاوه لێزانه کان له به ر تیبینی ئه ده ب هه تا دوای فه وتی حه زره تی شێخ (محمد علاء الدين قدس سره) به ئاشکرا و به شێوه ی ره سمی ئیرشادی نه فه رمووه به لام ئیجازه ی ته وه جوه و سه ر په رشتی مورید و مه نسوبانی هه ر پێ سپاردووه جا له سالی (١٩٥٤) زاینی دا که حه زره تی شێخ (محمد علاء الدين قدس سره) کۆچی دوایی فه رموو حه زره تی پیر به ره سمی جێگه داری و وه زیفه ی ئیرشادی گرته ده ست و تا ئێستا که (٨-١-١٩٩٥) زاینی یه سوپاس بۆ خوا له سه ر ئه م ئه رکه پیرۆزه و پر له شانازیه به رده وامه و له مال و خانه قای تازه دروست کراوی خۆی له ئه ستانبول ئیقامه ی حاصل فه رمووه. بێ گومان هه ر که س به چاوی ئینسافه وه بروانێ ئه زانێ که له هه موو بواریکدا ئه مرۆ له عاله م دا هاوتای نی یه. جا له ماوه ی ئه و یه ك مانگه دا که له گه ل کاك حسن محمد صالح. قه لادزه یی له خزمه ت حه زره تی پیردا خه ریکی ساغ کردنه وه و بژار کردنی ئه م دیوانه بوین شه وێکیان له هه موو باسێکه وه قسه هاته پێشه وه و له میانه ی قسه کاندا حه زره تی پیر فه رمووی فلانی عه رزم کرد به لێ قوربان: فه رمووی شتیکت پێ ئه لێم بینوسه به لکو له م دیوانه دا بلاوی بکه یته وه.

ئه مجا فه رمووی مه به سته که م ئه وه یه من هه رچی له سه روه ت ومالی دونیا خه رج وسه رفی بکه م به خه یالما نایه وخه فه ت به سامانی دونیاییه وه

ناخۆم ئه وه ی که زۆر جێگای خه م و ئه سه فی منه ئه وه یه که له ئه ولادی
ئه و بنه ماڵه ی ئێمه که سێکی وایان تێدا نی یه خه ریکی سه یر و سلوك بێ و
بتوانێ بۆ پاشه ڕۆژ نه هێڵێ خێرو ئیحسانی بوزورگانی ئه م خانه دانه ببرێته وه
به ڕاستی ئه وه زۆر جێگای ئه سه فه که هیچکام له ئه ندامی ئه م خانه دانه
له سه ر ڕێبازی باوك و باپیرانی خۆیان ناڕۆن له گه ڵ ئه وه شدا ئه بیستین
چه ند که سێك له م بنه ماڵه ئیستیفاده یان له دڵپاکی مرید و مه نسوبی ئه م.

خا نه دانه کردووه به بێ ئه وه ی ته نانه ت واجباتی دینیش به ته واوی
به جێ بهێنن یا به چاکی ئا گایان له ئه حکامی زاهیری شه رع بێت به
هه موو جورێك خه ریکی عه وام فریبین و به ته مای ته کیه و خانه قان به ڵام
بێ خه به رن له وه ی هه رکه سێ له هه ر ڕێگایه که وه بێ و به هه ر
ناوێکه وه بێ هه رچی له خه ڵکی وه ربگرێ بێ گومان لێ ی حه رامه مادام
شه رت و مه رجه کانی ئیرشادی تێدا نه هاتبێته جێ که ئه وانه به چاکی
ئه زانن نه ك هه ر هیچ پله و پایه یه کیان له ته ریقه ت نه بریوه به ڵکو هه ر
بۆنی ته ریقه تیشیان نه کردووه جا من ئه ترسم خه ڵکی دڵپاك و ساده له وح
هه ر ته نیا له به ر ئه وه ی که ئه مانه له ئه فرادی بنه ماڵه ی ئێمه ن ده وریان
بده ن و به ناو شێخایه تیه وه خزمه تیان بکه ن که بۆ هه ردوك لایان زیانی
هه یه و حه رامه جا ئه وان ئه گه ر ڕاست ئه که ن ئه یانه وێ بگه ڕێنه وه بۆ
ڕێبازی ئه و چه ند پیاوه گه وره ی خانه دانی عوسمانی من ناڵێم بێن بۆلای
من ئه وه مه ولانای برام له لایه ن حه زره تی شێخ(محمد علاء الدین قدس
سره) وه ئیجازه ی هه یه برۆن بۆ لای ئه و تۆبه و ته مه سوك بکه ن و چه ند

ساڵێك خه ریكی سلوك و ئادابی ته ریقه بن جا هه ر كاتێك به هۆی هه وڵ وكۆششی خۆیان گه یشتـــنه پله و پایه یێكی وا كـه بتوانن له ڕێباز و ئادابی ته ریقه ت دا یارمه تی خه ڵك بده ن و ڕێنوێـنیێكی به حه قی موسوڵمانان بكه ن منیش ڕازیم و زۆر مه سرور ئه بم وه ئه گه ر ئه وان لێ ببڕێن بۆ ئه م ڕێبازه پیرۆزه من هه موو شتێكی خۆم بۆ ئه وان ئه وێ به هه ر حاڵ :

ئـــه وه ی شـــه رتی به لاغه وا ووتم پێت

ئه تۆش گوێ ئه گری یاخو زویر ئه بی لێم

كه یفی خـۆتانه من ئه سه ف بۆ بێ كه سی ئه م خانه دانه ئه خـۆم ئه گینا ته ماعم به كه س نی یه: با بچینه وه سه ر با سه كـه ی خۆمان هه ر چه نده ماوه یه ك له مه و به ر دیوانێكی تری حـه زره تی پیر به هه ردوو زمانی فارسی و كوردی چاپ كرا به ڵام له دوای ئه وه چه ند غـه زه ل و هه لبه ستی كۆن و تازه ی هاتووه به خـه یاڵی پیـرۆز یا ویستـمـان ئه وانه ش وه كـو ته واو كـه ر و پاشكۆ یه ك كـۆبكرێته وه و چاپ بكرێن تا له ناو نه چن و خه ڵكی كه ڵكیان لێ وه ربگرن جا ئه گه ر سه هویه كمان تێدا كردبێ یا چه ند غه زه لێكمان له بیـر چوبێ نه ك هه ر داوای لێ بوردنتـان لـێ ده كـه ین و به س بـه ڵكو له دڵسۆزیتـان ده خوازین كه هه ڵه كـان ڕاست بكه نه وه و له گه ڵ هه ڵبه سته فه رامۆ شكراوه كان بۆمـان بنێرن بۆ ئـه وه ی بتـــوانین له داهــاتودا بـڵاویان بكه ینه وه بۆ خوێنده وارانی به ڕێز و ئێوه ش به ش به حاڵی خۆتان.

خزمـه تێكتان به كـتێبخانه ی شیعـر و ئه ده بی كوردی كـردبێ كه هۆی سوپاس و پێزانینه. كاتێ نوسـینی ئه م پێش نوسیه م كۆتایی پێ هێنا له ماڵ و

خانه قـای حـه زره تی پیر له نزیك گونـدی خادم كۆی ده ور و به ری شـاری ئه ستانبوڵ له ڕۆژی (٨-١-١٩٩٥) زایـنی کـه له گـه ڵ برای به ڕێزم کـاك حسن محمد صالح قه ڵادزه یی دا خه ریكی ساغ کردنه وه و بژار کردنی ئه م دیوانه ی حـه زره تی پـیر بوین کـه سـوپاس بۆ خـوا بـه پیٚ ی توانا ئه وه ی پێویست بو ئه نجامدرا بۆیه حـه ز ده که م پڕ به دڵ سـوپاسی برای ناوبراو و برای به ریزم کـاکـه خالد رفـعت الفـقـیه بـکه م که زۆر هه وڵیـان له گـه ڵ دام هیوادارم خوای گه وره بویان بخاته به ر ئه جرو پاداشتی ڕۆژی دووایی.

ئیتر هیوام سـه رکه وتنی هه موو لایه که وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم.

٧ شه عبانی ١٤١٥ کۆچی به رامبه ری ٨-١-١٩٩٥ زاینی

له ئه ستانبوڵ له ماڵ و خانه قای حه زره تی پیر

عبد الله مصطفی صالح فه نایی

## ﴿نه فسێکی پاکی موتمه ئین هه رگیز کووا خه تا ئه کا﴾(١)

نه فسێکی پاکی موتمه ئین هه رگیز کووا خه تا ئه کا
خاوه نی میهر و ئولفه ته هه رده م به تۆ وه فا ئه کا
ئولفه تی روحی پاکته یه ك به یه ك ئه دا خه به ر
سڕری سه فا به دڵ دوعا نه قشی هه تا هه تا ئه کا
ئولفه ت و میهری پاکی دڵ دایم به دڵ جه لا ئه دا
ئاینه بۆ ئاینه یه ك هه تا هه تا نومائه دا
زکری ڕه ببانی له سینه گه ر حه قیقی ڕووبدا
هه ر پێنج گڵۆپی سینه خۆی ئینشائی سینه ما ئه کا
میهری سه می ی ئه و که سه که بۆ هه مووکه س ئه و که سه
عوسمان ئه خاته وه جده وه به گیان ودڵ سه فا ئه کا

***

## ﴿شه و هات و نه ما تاقه تی نوسین به خه یاڵات﴾(٢)

شه و هات و نه ما تاقه تی نوسین به خه یاڵات
مه رگی شه وی هیجرانه ئه وا کـه وتمه حاڵات
چون نایه ته ده س دیده ن و دیداری تۆ به م زوو
خه و چاکه برا به ڵکه به خه و بێته وه باڵات

---

١- وه لامی حه زره تی شێخ بۆ خوالێخوشبوو حاجی مه لا ئه حمدی قازی که ئه م پارچه هه ڵبه سته ی دابو خزمه تی پیرۆزیان:
نه فسی خه سیسی ناکه سم هه رده م ئه گه ر خه تا ئه کا
خاوه نی نه فسی ته ییبه هه م عه فو و هه م عه تا ئه کا

٢- حه زره تی شێخ فه رموی سه عات حه و تی شه و بو نامه م ده نوسی بۆ مه و لانای برام و سید مظهری کاتبی حه زره تی شێخی باوکم بێ تاقه ت بوم و خه وم ده هات ئه م هه ڵبه سته م نوسی و خه وتم له خه وا بینیم سید مظهر نامه م بۆ ده نوسێ منیش مه به ستی حاڵی بوم که هه ڵسام وه ڵامی نامه ی خه وه که م دایه وه و نارد م بۆی کاتێ که نامه ی هات هیچ ووشه یه کی که م و زیادی نه بو له گه ڵ ئه وه ی من له خه وا بینیبوم و وه ڵام دابۆوه هه ر چه نده ئه م غه زه له له دیوانه که ی پێشودا بڵاو کراوه ته وه به ڵام چون چه ند شعرێکي که م بو بۆیه حه زم کرد به ته واوی لێره دا بڵاوی بکه مه وه.

تا بەڵکو بە خە و شە رحی فیراق و مە بە سی دڵ
ڕوون کاتە وە عوسـمان وبڵێ نامە ئە وا هــات

***

## ﴿هۆنراوە ی دووری و گە وهە رت کە هات﴾ (١)

هۆنراوە ی دووری و گە وهە رت کە هات
دڵ خۆش بوو بە مهر خە زانە ی وە فات

سینە و دڵ پڕ دە رد محنە ت و هیجران
مـە پرسە چۆنە « هیـهات هیـهات »

بە ڕیز هۆنراوە و خـە ت و خامە کە ت
هـیجرانی لابرد نە هـات بوو بە هـات

ڕوجیاری خلوس شە وقت کە هە ڵ هات
تاریـکی دوری فـیـرار بو هــە ڵات

یا ڕە بی خۆش بی بۆ عە شق و وە فات
بە د خواهت زە لیل خوار ومات و لات

دوریـت دڵ پڕ خوێن تاسـە ت فـراوان
لە دور ماچ ئە کە م دوو چاوی شە هلات

تـا بـە ڵـکە ڕۆژێ لـە ڕۆژ گـاران
بتبـینێ عوسـمان وە ك جـاری جاران

***

(١)- وەڵام . « شێخ محمد شێخ احمد » لە ساداتی « ابا عبیدة »

## ﴿شاهه که م سوڵتانی دین قیبله ی یه قین قوتبی مه دار﴾ -١-

شاهه که م سوڵتانی دین قیبله ی یه قین قوتبی مه دار
باعیسی ته زیینی دڵ نووری له تیفه ی سه د هه زار
با فیدات بێ روح و گیانم ماڵ و ئه ولادم هه موو
بۆ قه زاگه ردانی باڵات شایقم ده رچم له شار
بۆ زیاره ت خاکی به ریێ ی شا به جاریێ حازرن
هه رچی مه نسووب و موریدن موخلیسی یار و دیار
وا به شه وقۆ هاتوون ئه م جه معه لایانه یه قین
بیاره خاکی وه ك به قیعه زه م زه م ئاوی سه رچنار
ساله فه وزی فه یزی لوتفت با نه بین مه حرووم و زار
ئه مر ئه فرمووی بێین نه یێن یا خو به چین ده رچین له شار
دیده یی عوسمان به سورمه ی گه ردی پێته ئینتیزار
بۆ حوزوورت مه سته مه خمووره دڵ و دیده ی خومار

***

١- خواڵی خۆشبوو شێخ الاسلامی مه ریوان ئه ڕوا بۆ بیاره بۆ حضوری حه زره تی شێخ علاء الدین وه داوای لێ ئه کا شێخ ته شریف بابو مه ریوان کاتی شێخ گه ییشته هه ورامان ئه م شعرانه م ته قدیمی حضوری کرد و ده رم بڕی که بڕۆم بۆ خزمه تی یا بۆ په زیرایی خۆم ئاماده بکه م له (ژنین دا) وکاتێ حه زرتی شێخ ته شریفی هاورد جه ماعه تی کوردستان به ئه ندازه یێ هاتبوون که ڕۆژی پێنج تاشه ش سه ر حه یوان ئه مجا ڕه سایی بکردایه تا ڕاده یێ که شێخ فه رموی عوسمان ئه ته وێ هیچی نه یه لێتۆ عه رضم کرد قوربان هه رچی سه رف بکه م که مه و زیادی نی یه وه له خزمه تیا چوم بۆ مه ریوان.

# ﴿بۆ خاڵۆی مەعرووف عارف بە ئیخلاس﴾(١)

بۆ خاڵۆی مەعرووف عارف بە ئیخلاس
کەمەر بەستەی عیشق پیران بە ئیخلاس
خاڵۆی عەزیزم دڵ شکاویتم بیست
باوەڕت بێ مەئیووس بووم لە زیست
ئەمما خاڵۆگیان دونیا هەر وایە
«کل من علیها فان» ئەمری خوایە
تێ فیکرە لە وەعدەی جوانی صابرین
وەعدەی حەق حەقە بۆ خولدی بەرین
بۆ دڵ شکاویت دڵم شکاوە
ڕوو بە حەق وەستام دەس بە دوعاوە
یا خوا تۆ خۆش بی دونیا وەهایە
پڕ لە زەحمەت و دەردو بەلایە
جەزای ئاخیرەت (اکبر و کبیر)
بۆ موقەدەرات هیچ نی یە تەدبیر
قەزا هەرچی بێ بێجگە سەبوری
عوسمان کووا دەوای دەردی مەهجوری

***

---

١.لە وەڵامی عارف ئاغای گەڵاڵی دا نووسیویە

## ﴿چاو نه بینێ ئه شکی حه سره ت دڵ پڕی خوێنی فیراق﴾(١)

چاو نه بینێ ئه شکی حه سره ت دڵ پڕی خوێنی فیراق
نایه سـه ر له وحی دڵ و گیان نیـێشی نالینی فیراق
دایه سـه رزارم به زاری ده رده کـه ی تاڵی فیراق
پێم ده کا ئاخر له هیجرت وه رهه می داغی فیراق
تابه که ی عوسـمان بنالێنێ به حـوزنی ئیفتراق

***

## ﴿چاوه که م گیانم نیگارم عه ینی عه ینه ینی که مال﴾(٢)

چاوه که م گیانم نیگارم عه ینی عه ینه ینی که مال
بێ جه مالت دیده گریان سینه بریان پڕ مه لال
با عیسی ته سکینی دڵ نوری دیده ی ئه شکبار
قاسدی شه وق و په یامم وه ك سه بای بادی شه ماڵ
جابه یان کا سۆزی دڵ سۆزی به یانی بولبولی
ره ونه قی گوڵ عه تری سومبول لۆلۆی لالای جه مال
هه ر وه کو جارانه جانانه نومایانه سه فا
بێ شکه میهرت له دڵدا لۆلوی لالای که مال
گه ر تلووع کا شه مسی ڕووت بۆ به زمی مه یخوارانی عیشق
شیشه یی دڵ دیته به زمی نه شئه یی ساقی به باڵ
شێوه ی شیرینی شیعرم بۆ جه مالی خه سره وت
پڕ له ته زیینه سوواری شه وقی گوڵ ڕه نگی خه یاڵ

١- بۆ شێخ مولانای برای نووسیوه.

٢- بۆ یه کێ له دۆستانی نووسیوه

گــه ر نکوولی قاســدم بو بێ وه یا کــۆلّی قــه ڵه م
که وڵی شه وقم وا به کۆلۆ وگه وهه ره و دوڕه و لوئال
کــه وتمــه گێژی فیراق و ده ردی دوری ناته وان
کوا ده واکا حاڵی عوسمان په یکی قه ڵه م به زوانی لاڵ

## ﴿چاوه که م نامه ی چکۆله ت بۆ شیفای ده ردی سه رم﴾(١)

چــاوه که م نامه ی چکۆله ت بۆ شیفای ده ردی سه رم
هاتــوو ئازارم نــه ما نــامه ت کــه نامه ســه رســه رم
ڕوحه که م گیانم عه زیزم موخلیسی شیرین که لام
مونیــسی قه لبی حه زینــم یاوه ری دڵ په روه رم
چــاوه که م ســاتێ ده قیقــێ دوور بێ چاوانــت له چــاو
که م ده بێ بینا یه که م غه م ده یگرێت و شه ش ده رم
نه سته ره ن نه سرین وه نه وشه یاسی چه م به رزاز و په ڕ
قووه تی دڵ قووتی روحم هێزه که ی باڵ و په رم
با وه فــایه و پرســه فا یــه مه حبــوبی ما مه طلوبی ما
مه زهه ری نووری شه هه نشــاهی که مالی ســه روه رم
حه مدو (للّه) سه د شوکر بێ ده ردی دڵ ئازاری سه ر
ده فعه ته ن ڕه فعی بووه ئــه ی یاره که ی قه د عه رعه رم
نامه که ت ته سکینی دا ته ئمین له یارێــکی عه زیز
ئومنی یه ت حاسڵ بووه گه ر ئه و نه بێ بگرێ ده رم
من له ساغی و نا خۆشی ئانی شیفا وه خه تی به لا
ویردی دڵ زیکری زوبان هــه رتوێ به عوسمان دڵبه رم

***

---

١– بۆیه کێ له براکانی نووسیوه

## ﴿وا مه زانه من له دوورڕۆ مه یلی دووری تۆ ئه که م﴾(١)

وا مه زانه من له دوورڕۆ مه یلی دووری تۆ ئه که م
به و خووا لوزانی فیکرم سه رفی شه وری تۆ ئه که م
سه د ئه وه نده گه ر له هیجرا بم له بۆ ده ردی فیراق
هه ر له دوورو ده ور ئه ده م وا شینی دووری تۆ ئه که م
گه رچی چه ندێکه شه ریکم هه مم و غه مم یاوه ره
یاوه ری دڵ هه ر به ئینشای به حسی خه یری تۆ ئه که م
دڵ به خه نجه ر پاره بێ له ت له ت بێ جه رگم داکه وێ
چاپخانه ی عه کسی گه ر من نه قشی غه یری تۆ ئه که م
جسم ئه ر بێ مه ستی نه شئه ی نازی بازیچه ی که سێ
گیان و روح و دڵ به جارێ شێت و ده یری تۆ ئه که م
حه وزه یی جه لسه ی وه زاره ت ده ستگاهی مه عریفه ت
وا خه ریکم من له گه ڵ ئه و فیکری خه یری تۆ ئه که م
چاوی عوسمانه که مه حروومه له شوعله ی ڕوویی تۆ
له و په ژاره من ژماره ی حوسنی گوڵ ڕووی تۆ ئه که م

***

## ﴿ده مێکه دیده وا یعقوب ئاسا کوێره بۆ یوسف له دوریدا﴾(٢)

ده مێکه دیده وا یعقوب ئاسا کوێره بۆ یوسف له دوریدا
له بو وه سڵی جه مالی ڕووت ئه گه ر غه وغا نه که م چی بکه م
ده سا بۆ خووا له عه تری بۆی شه میمی مهره که ت گه ر بێ
له سه ر ته بڵه ی عه تاری فه خر و شانازی نه که م چی بکه م

---

١ــ بۆ شێخ مه ولانا برای نووسیوه له دوورودا
٢ــ له سه ر وه زنی هۆنراوه یه کی شاعیری به ناو بانگی کورد مه حوی ئه م هۆنراوه ی داناوه که وو تو یه تی
«ده مێکه شاری پڕ شۆڕی موحه ببه ت ماتو و خامۆشه
به قانونی ته جه نون شۆڕشێ ئینشا نه که م چی بکه م»

به شه رتێ سککه یی مهر و مه وه ده ت بێته نیازی دڵ
له شادی گه ر به دینار و دره م بازی نه که م چی بکه م

له مه یدانی حه سودانا له سایه ی چاوی چاو بازان
به سواری ئه سپی حه مدانی که ڕم بازی نه که م چی بکه م

که شوعله ی ڕۆژی ڕووت ڕۆژێ طلوع کا گه ر له مه یدانا
وه کو مه جنون له سه حرا شیوه نی له یلا نه که م چی بکه م

عه زیزا وا له سه حرا وێڵ و سه ر گه ردان و محرومم
له سینه ی پڕ له ئاهم داد و فریادێ له شاعوسمان نه که م چی بکه م

## ﴿حه مه گیان نامه ی ڕازیاوه ی شیرین﴾(١)

حه مه گیان نامه ی ڕازیاوه ی شیرین
به شیعری مه وزوون قافیه ی ڕه نگین

هاتوو چو ده ردی دڵه ی خه مینم
ڕوناك بو دیده ی پڕ له ئه سرینم

یا ڕه بی شادبی دڵت ئاوا بێ
ئاوا بێ ماڵت وه ك قه سری شیرین

باخچه ی لا ماڵت به گوڵ و لاله
ڕازیاوه ی ڕازاو به گوڵه نه سرین

سه مه ری باخت کۆرپه و ساوا بێ
به سێوو قۆخ و هه ناری شیرین

١ـ «محمد»ی برازام بڕێك شعری بۆ نووسیبووم له وه ڵامیا ئه م شعرا نه م بۆ نووسیوه

عومــــرت درێژ بێ ژینت به خۆشی
به نوێژو تــــه قوا ئه مــــان و ئه مـین

عــه زیزم چــاوم هه دییه ی شـــوان
یا هـــاڵه کۆکــه یا شنـگی شـیرین

بازێ ئه سکه ناس بێ قابیل بێ ناز
نــاردم عه مه له ت بــا نه بــن خه مین

یا ڕه ب ئاوا بێ مه نزڵ به خۆشی
تــــه بریك ئه نێـرین به دڵ به یه قین

عوســـــمان ته قــالای ڕۆژوشه وانی
هه ر بۆ ئێوه یه بـگرن ڕێـگای دین

***

## ﴿به یادی تۆیه به خوا ڕاحه تی دڵ مه رهه می زامان﴾(1)

به یادی تــۆیه به خوا ڕاحه تی دڵ مــه رهــه می زامان
له سه یلی دیده جاری بوو فوواره ی سه یلی بێ سامان
له گێژاوی ســـروشـکا گێژو و وێژی ده ردی بێ ده رمان
بــــه داییـــم مات و مه بهووت و ئه نین و ناڵه و ئه فغان
له کوێ یه دا خۆ خاله که ی دڵ ڕوحه که ی عوسمان

***

1- بۆ شێخ مه ولانای برای نووسیوه

## جوان و میری خۆمە واکە دیمۆ (١)

جـــوان و مـــیری خـۆمە واکــە دیمۆ
نە جاتم بوو لە دە س دە ردی جە حیمۆ

شـــوکر بۆ ئـــە و خووایە ی تاکو پـاکە
کـــە بێ میســـلە بە ئە وسـافی قە دیمۆ

بە ســـە ییارە ی خە یاڵی دیدە نی ڕوت
بـــە تە یـیارە ی وە فا دیســان فڕیمـــۆ

یە قینـــە خۆشـــە ویـستی پیرو جووانی
کـــە دڵ ئاییـــنە یـــە بۆ دڵ بـــڕیمۆ

لـــە خۆشـی تۆیە وە رنە شـیعرە کانم
نمونـــە ی وا لـە دڵ هە ر لە قـــە دیمـــۆ

کە عوسمانی حە زین ئە ڕجوی وە هایە
عە فـــوی بۆ بێ لە ڕە حمان وڕە حیمۆ

***

---

١- بۆ یە کێ لە دوستان نووسراوە

## ﴿دڵە هوشیارۆ بە بە سیە نیشانە ی مە وتە پە یدایە﴾(۱)

دڵە هوشیارۆ بە بە سیە نیشانە ی مە وتە پە یدایە
کە عومرت ئاخری پایە عە لاماتی هەووە یدایە
هە تاکە ی پە ستیی و مە ستی بە بە ستە ی خە ستە وە سستی
لە خە ودا ماوی بە د مە ستی نە هوشیاری لە خە ودایە
بە سە بە س دڵ مشە ووە ش بێ بە وە سواسۆملە ووە س بێ
لیباس ئە ر خاسی ئە تڵە س بێ ئە گە ر دارایی و فایە
ئە گە ر غە ز یا غە زە ل یا تاقە یا شیرداغە هە ر داغە
ئە گە ر تاجی (مرصّع) نە شئە یی شاهیت لە سە ر دایە
ئە گە ر تە ختی کە ییت بێ جامی جە م گە نجینە یی خە سرە و
لیباست جاوە جێت غارە لە وێ جە ستە ت لە وە ی دایە
نە دە نگ و ڕە نگی ئە حبابە نە دۆست و یار و ئە غیارە
بە شیددە ت جێتە ئە و غارە هە رچی کردووتە ئە فشایە
بە جوز حە یی موعین، ڕوحی ئە مین و شافیعی ئوممە ت
وە سیلە ت مورشیدی کامیل بە ڕوحانی لە ویدایە
بە هە وری میهری دونیاوە موحیبە ت وا دڵی گرتی
نە ما فیکری ئە مە ل بۆ قووە ت و قووتی گرانمایە
لە بازاڕی تە مە ع حیرص و شە وە زە نگی حە سوودی دڵ
بریسکە ی ڕە عد و بە ڕقی ئە و پساندی ڕوح و سە رمایە
لە خاوی غە فڵە ت و خواری نە بێدار و خە بە ر داری
هە موو زوواری ڕێی شاری ئە جە ل ڕۆیین و هە مسایە
ئە گە ر چە ند قە سری زێڕین حووری عین و زێوە رینت بێ
فە نایە فایدە ی کامە لە دونیایی دە نی دایە

---

۱- ئامۆژگاری بۆ موریدان و مە نسوبان

لـــه گه ڵ ئاوی حـــه یاتیـــش «کل نفـــس» ذائـــق الموته
ده فـــه رمێ حـــه ق له ئـــه و ڕۆژه «لمـــن الملـــك لله» یه
مه له ك خۆنـــدی لـــه مه وتا یه ك یه كێ له م لاوو له و لاتۆ
له وه و لا تۆیش ده خوێنێ بۆ ئه جه ل ئه مڕۆژ و فه ردایه
ئه جـه ل دامێنـمان ده گرێ بـه ناكاو دێر بـێ یا خۆ زوو
ئه میشت چوو ئه ویشـت چوو كـه دوو داغت له دڵ دایه
له داغی زاغی دونـیا و داغی باغی بێ ســه مـه ر نه خلت
گرفتار بووی به بێـوه ی دێـوی دونیـای پووچـی بێ مایه
دیـــاره شـاری دڵ وێـرانه تـــاره ته نگـــه مـــه خڕووبه
به نه حســی نه فس مه نكووبه هـــه زاران قه سوی تێدایه
شـكایه ت بـــه ینه لای زاتێ كـه سوڵتان و شه هه نشایه
لـــه ته عمـــیرا موهه یایه چـــرای ته نـــویری یـــه لدایه
برا بێن بۆ خـــووا با زوو بكه ین ته دبـــیری ده ردی دڵ
نیـــگاهی مـــوڕشیدی كامـــیل ســه فـایی قه لبی گومڕایه
ته مه سوك كه ین به زه یلی شاهی ئه حراڕو سه می عه تتار
دوورِی نا ســفته ی شـه هـوار و فه یزی غه وسی به غدایه
«هـــو الحبـــل المتـــــین ان تمســـكـت تصـــل بالله»
به وه الله نـووری لوتفی حه ق له كه سبی حوببی ئه و دایه
مـــوریدان بێـــنه وا بێـنۆ به جـارێ ده وری ئـه علایه
به ئایـاتی ڕومـــووزی موســـته جـابه هه ر ته مـــه ننایه
ئه گه ر بێـتو مورابیت بی به فه یزی زوهد و ته قوای ئه و
ده چـــیته چـــینی یاران و نه جـه نگ و ده نگ و ده عوایه
مه ســـیح ئاسایه ئه نفاســـی كه حه ســری خضر و عیسایه
كه خه رق العاده تی وایه عه سای مووســای له ده ستدایه
له سـیڕِی خه ڵوه تا شایه به سـه روه ت خۆ شه هه نشایه
له ســـه قفی عه رشـــی ئه علایه عـــه لایه بۆیه ئـه علایه

تلووع كا گه ر شه هی ئه علا له سه ففی خه تم و ته هلیله
لـــه لایه شـــۆر و غـــه وغایه له لایه زیـــكری « الله » یه
بـــــه بۆته ی یـــه ك نه زه ر وا دڵ به ئیكسیرۆ ده تاوینێ
كه ئه ســـڵا ژه نگی نامـــێنێ ته ڵایی ئه حمه ڕیش وایه
وه ها ده یخاته نـــێیو قالۆ كــــه خه وش و خاڵی نامێنێ
ته وه جـجوه زه ڕبی ڕابێنێ له نه قشی ڕاسو چـه پدایه
بـــه چاپخانه ی مه كینه ی تازه عه كسی وا سكه ده گرێ
كـــه ســـوڵتان ئه ولیاو و شـــاهی له ولاكی له سنگدایه
سه فای نووری له تیفی ئه و « موئه سیر » بێ له هه ر قه لبێ
به ســـه فوه ت جـــه لبی وا دێنـێ به عـــه ینی خۆیه لێرایه
له بازاڕی شه هی خووبان به دڵ مه سره ف كه نه قدی دڵ
حه واســی خه مسه و و خه مسه ی له تایف بۆ ته جه للایه
كه ڕووی دا حه زره تی دڵ دار « بحمد الله » ده بی هوشیار
به « اصل الاصله » ئه ســڵی كار و ئه ســـڵی ئه و موعه لایه
عـــه زیزا مووته شه یخ زۆره بێ ئوســـتاد و بێ ته علیم
له ڕێـــگه ی تـــاری بو تـــڵانن نه تار و پوود و هه ودایه
مه شیخه ت كه سب و ته علیمی دڵه ده فعی ڕه زائیل بێ
نه وه ك هه ر ســـه ر به خۆ كه ســـب و ته كلیفی گرانمایه
له ڕێگه ی ڕاستی شه رع و ته مه سوك مورشیدی كامیل
مـــه ڕاتـــب ته ی بكـــا تـــاكو ئه گـــاته ئـــاخری پایه
بـــه ته زویر و ڕیا ڕامی وه سیـــله ی جـه ڕڕی هـــه ر حیله
به فـــتوای قالو ئه م قیـــله فریب بـــێ ڕه یـــبه ئیخوایه
بـــه « قال وقـــــیله » فتوا بۆیه فه وتا ئه سڵ و نه سلی دین
ده ڵێن شه رع و ته ریقه ت فه سڵی زۆره نه ك له یه كدایه

تـه ریقــی ڕێ ی حــه ق و باتڵ بــه میزانی بســه نجێنه
شــه ریعه ت ئاییــنه و ڕێ یه نه وه ك ئه م لاوو ئه و لایه
مـوریدانی «بحـمد الله» مـوزه کـکا و مـوزه ککیـر بوون
هــه موو ده ڕاکی ده رکـی زوون له تایفــیان موسه ففایه
له به حسی مه سئله ی شــه رع و ته ریقا دایما بێ شك
شوکر شه که ر شـکه ن شیرینه نه ســایحیان موسه ففایه
به ســه د فیکری ده قــیقۆ یــه ك ده قیقـه غافڵی نایه
به مــه ولایێ له مــه ولایێ له وه و لا سـرِی ئــه خفایه
چ خۆشه گه ر بده ی روح و سه ر و ماڵ و دڵ و دینت
به ده ســت ئه و زاته ئاییـنـت ئـه مینی ئه و ئه و ئه دنایه
به قه لبـی دوون و نادانی ئه گــه ر مونــکیر ببێ با بێ
بمێــنێ گــه ر لـه ئینکار ئاشــکارا زه نبــی به ر پایه
له میهری هه ر دڵێ پڕ بێ به مه رگــی مه رگــی بۆ نایه
له زیــکرا زینـدووه نامرێ موحـه قه ق حه ییه ئه حیایه
سیراجی حه زرتی عوسمان زیای عه دلی عومه ر فارِوق
به هــایی بابه هــا عه ینی به عــه ینی عه ینی شه هلایه

***

## ﴿به یانی نامه که ت وابو که دڵ زۆر ئاره زوی تۆیه﴾(١)

به یانی نامه که ت وابو که دڵ زۆر ئاره زوی تۆیه
به ڵـێ ئایینـه دڵ بـۆ دڵ کـه ئاییــنه ی منـو تۆیه
به گه رمی و سۆزی دڵ سۆزی شکاتی ناری هیجرت کرد
گــرت به ردا که نــاری سینه ، ئاهم عه ینی پشکۆ یه

١ـ له وه ڵامی شێخ حمه ئه مین کاردۆخی دا نوسراوه

به یانـت باسـی دوری کرد و چـاوی ئه شـکباری تۆ
وه ره بێ تـۆ تـه ماشـاکه فوواره ی دیـده بـێلۆیه
لـه نه هره ینـی دو چاوم جاریه دوو به حری گوڵناری
سروشـکی لیـڵ و ئاڵـم تیـکه ڵـه دوڕودی دوڕویه
حه قیقه ت عه تر ئه فشانی ده مـاغی میـهری پڕ کردم
موحه ببه ت گه رمه بازاڕی وه فا به وعه تری شه و بۆیه
نه سیمی میهر و ئولفه ت یه کیه تی گه ڕێتو یه ك بگرێ
کـه ژ و کێو با سه فاو قه دری هه موو یارانی مه ڕوویه
ئه گـه ر بێتو سـه با بێنێ نه سیـمی وه سڵی یا رانم
جیهـانێ شـوعله ئه فزایه به میشکی و شکی خۆ شبۆیه
به هاری وه سڵی یاران و نیگار ئه ر ده س بدا بێ شك
ده ر وده شت ، کێو و سه حرا پڕ ده کا له و لا له گوڵ ڕویه
لـه زسـتانی فیڕاقا گـه ر ده پرسـی حاڵه کـه م چۆنه
له سـه ردا گه رد و بادێوه ته پودوی سیـنه شاهۆیه
یه خ و یه خ به ندی ئاهم بوو که دو ڕووی دووڕوه به ستی
ده ماوه ند بو ته می سیـنه م که حه یران وسه نا گۆیه
لـه داخی هیـجری یاران و مه هی شـیرین غه زالانم
له گه ڵ ئه م ده رد و سه رمایه ده رونی سینه بۆ سۆیه
حـه قیقه ت وایه بۆ ته نقـیدی ئه و زاتانه نوسـیوته
که سـێ گه ر وابێ بێ ویجـدانه بێ ئیمانه خۆ خۆیه
مه که مه نـعی ئه وانه خۆ خۆرن مه علومه کابرا خۆی
وه های زانیوه مه ردی هـه ر به یاڵو باڵو ئه ستـۆیه
مه شیخه ت شاهی و سه ر داری عه شره ت میر و ئاغاله ر
به به زل و به خشش و فه یز و که ڕامه ت پیشه یه ك ڕوویه

مه ككارى و دڵ ڕفێنى و شۆخى و عاشق كوژى هه رده م
به ناز و عيشوه و له نجه و ئيشاره ى چاو و ئه برۆيه
كــه مه ندى زولفى تاتاكــه ى بخاته گه ردنى عاشق
كـه مان ئه برۆ، موژه نوكى خه ده نگ،زنجيرى گێسويه
له يه ك ڕه نگيته عوسمان وا له دورڕودا له يه ك ڕوويى
زوبان وه ك توتــيي گۆيا وه فا گــۆيه ســه فا جۆيه

***

## ﴿له ده ردى ظوڵه ت وغه فڵه ت ده سا زيكرى نيهان بابێ﴾(1)

له ده ردى ظوڵـه ت وغه فڵه ت ده سا زيكرى نــيهان بابێ
لــه وه ختى قه ســوه تى قه لبا ده خـيله ك با ئـــه مان بابێ
له عيشق و شه وق وجه زبه ى دڵ ده سم دامانى فه يزى تۆ
(توجه) بۆ دڵـــى زارم لـــه لاى شــاهى شه هان بــابێ
له بــه ر جــه زبه و ئه نيـنى من له به ر ناڵه و گــرينى من
ده ســابۆ ده ردى پڕ شــۆرم شــه ڕابى ئــه رغـه وان بابێ
زه ليلى ظــوڵه تى نه فــس و ئه ســيرى ده ســتى عيصيانم
مــه گه ر نور وفيــوضاتێ لــه ڕێى فــه خرى زه مان بابێ
گــڵوپى كاره باى ســينه بـه هـۆى نه فــسى خــه تابارم
فيــوزى وا كـــوژاوه ســـا فيــوزى فه يضتــان بــابێ
لـــه بۆده ورى مـــه عانى شــاهوارى نيــكته پــه ردازان
ثوره ييــاى شـعله ئـه فشـــانى چراى «روح البـيان» بابێ

---

1- حه زره تى پير له كاتى بير كرد نه وه و داواى مدد له خزمه ت حه زره تى (ڕه سولى ئه كره م ﷺ) دا نوسى ويه له ئه ستانبوڵ. ٣/٢/١٩٩٥.

فیدای خاکی به ری پێت بم جگه ر سوتاوو دڵ خه سته م
له بۆ ته سکینی زامی دڵ هه وای ڕەوضه ی جیـنان بابیّ

لـه عیشقی تۆ وه یه بالله سـه ر وچـاوو دڵـم قـوربان
بـه قوربانت ده که م فـه رموو به را تی عـاشـقان بابیّ

ئه گه ر مه یلت له دڵ که م که م ئه سیری کۆیی ئه ژده ربم
له نـوری عیـشقی ڕوت قوربان جه لای شاهانه تان بابیّ

به قـوربانی شـه هی فه خری زه مانم ساکه ڕه م فه رموو
ده خـیله ك ( یا رسـول الله ) نـدایی ( الامان ) بـابیّ

لـه یادو ذیـکری تۆ ئانیّ ئه گـه ر دڵ مات وغافڵ بیّ
ده سـاجه للادی قـه هری قه هره مانی جانـستان بابیّ

له خوانی میهر و لوطفت گه رکه ڕه م فه رمووی به ئیحسانت
به تـاکـه نیم نیگاهێکت حـه یاتی جـاویـدان بابیّ

زه لـیل و زارو بـیمارم ده خیـله ك ( یارسـول الله )
به لطف وجۆششی ڕه حمـت ده وای ده ردی دڵان بابیّ

غـولامی ده رگه هـی تۆم وسـه گی ده ربانی ده ربانم
به عوسمان به نده یی تۆ م، وه عده یی وه صڵی جینان بابیّ

***

## ﴿ دنیائه گه ر به زاهیری له پخشی خه تت وخا ڵ ئه کا ﴾[1]

دنیا ئه گه ر به زاهیری له پخشی خه تت وخا ڵ ئه کا

وه یا له به ژن وقامه تي نه مامی چوارده ساڵ ئه کا

به شێوه دیمه نی به هاربه وێنه عه یني مێرغوزار

به چاوی سه ربینه تۆ له ره نگی ئاڵ و واڵ ئه کا

چنور ویاس ویاسه مین وه نه وشه مل که چ وخه مین

به حوسنی ناز ونازه نین له ده وری سه رنه هاڵ ئه کا

به لابه چاوی دڵ ئه گه ر دنیا بده یته به ر نه زه ر

به بێ نیزاع وده ردی سه رله ماڵی پڕ مناڵ ئه کا

زیل وبه می هه واو هه وه س که ده رئه چێ له گه ڵ نه فه س

صه داو زره ی وه کو جه ره س سه ریش له زرکه تاڵ ئه کا

حه قیقه تی که ده رکه وێ ئه گه رحه قیقه تت ئه وێ

ده رونی پڕ له دوکه ڵی له چاڵ وکۆی زوغاڵ ئه کا

قه سوه ت وژه نگی مه عصیه ت ئه گه ربدا له هه ردڵی

ذیکرو عیباده تت هه موله ماڵی دڵ به تاڵ ئه کا

---

١- ئامۆژگاری بۆ موسوڵمانان به تایبه ت مریدو مه نسوبانی حه زره تی پیر ئه فه رمووێ که دونیا به چاوی حه قیقه ت بوی بروانی به هیچ دێته به رچاوت به قسه ی دونیا په رستان دڵ به دونیا وه مه به سته. کاتێك ئه م پارچه هۆنراوه که وته به ردست دیوانه که له ژێر چاپدا بوو به لام بۆ ئه وه ی خوێنه رانی خۆشه ویست لێ ی بێ به ش نه بن لێره دا بڵاومان کرده وه جا بۆیه داوای لێ بوردن ده که ین.

## ﴿صه فا گیان صه فات نه دور په یم ئامان﴾[1]

صه فا گیان صه فات نه دور په یم ئامان

صه فا ش داوه دڵ وه گه سته ی زامان

نامه ی شیرینت یاوا وه ده ستم

دڵ ئاما وه جۆش جه غه مان ره ستم

ده سم برد وه سۆز نامه نیگاری

په ی به یانی شه وق وه زارو زاری

حازربی وێنه ت نه چه مان ودڵ

وه شه وق ئه رمانا دیدارت چون گوڵ

چون دوریت هه رسات تیرێم په ی شانۆ

شه راره ی دۆ زه خ په نه م مه رمانۆ

بێ شك ئه رمانا ده ردی مه هجوری

جه دوریت صه فا نیام صه بوری

هه رچه ند په یامت فه ره ح دانه دڵ

ته سکینش جه کۆن جوزمه شامی گوڵ

ئاواتم ئینا وینوجه مینت

چه نی شێوه که ی شۆخ و ره نگینت

---

١ـ حه زره تی پیر ئه م هۆنراوه ی بۆ وه ڵامی نامه ی شێخ صفاء الدین ئامۆزازای فه رمووه که زۆر تاسه ی بینینی کردووه له ئه ستانبوڵ ساڵی ١٩٩٥ زاینی به داخه وه کاتێك که وته به رده ست دیوانه که چاپ کرابو بۆیه به م شێوه یه بڵاو کرایه وه داوای بوردن ده که ین.

که دیم خاڵی ڕوخی هه روه ك له سه ر صه فحه ی سه ما  که وکه ب
عه ره ق ده ڕژێته سه ر لیٚوو ده مـی بۆ ره ونه قی مه شـڕه ب
ده ڵێ ی ئاوی حه یات وکه و سه رن جه م بون له چای غه بغه ب
ئه تۆش ته قلیدی زولفی یارده که ی وا دیاره ئه ی عه قره ب
حه یا هـه روا له چـاو دا چی بڵـێ ی ئه ی کوێره موخـتاری

له نه حسـی به خـته که ت بڕوانه ئه ی دڵ چـه نده داماوی
بـه خاڵـی ڕوی فــریوی دای ئـــه وا خســتویه نێو داوی
دوو زولفی چین له سه ر چینی ده ڵێن (عوسمان) ئه تۆ خاوی
چوار چت قه ت مه که خواهیش له چوار که س (کوردی) تاماوی
له خۆت عه قڵ و له دڵ صه برو له به خت ئیمداد له یاریاری

***

---

١– حه زره تی پیر ئه م پێنج خشته کیه ی له سه ر هه ڵبـه ستی (کوردی) داناوه که بۆ شێخ (محمد صادق)ی وه زیری با پیری حـه زره تی پـیری وتووه.شێخ (محـمـد صادق) ی وه زیری نه قشـبـه ندی فـه رمانڕه وای ده وڵه تی ئێران بووه بۆ ناوچه ی هه ورامـان و مـه ریوان کـاتێ ئه گـاته هه ورامـان چاوی به حـه زره تی شێخ (عـثمـان سراج الدین)ی طه وێڵه (قـدس سره) ئه کـه وێ ده گـه ڕێته وه بۆسنه و واز له کـاروباری ده وڵه تی دینێ و له خزمـه ت حه زره تی شێخ (عـثمان سـراج الدین )ی طه وێڵه «قدس سـره» ته مه سسوك ده کاو ده ست به سلوکی صۆفیه تی ده کا تا ده گاته ئه وه ی حه زره تی شێخ ئیجازه ی ئیرشادی ده دا به ڵام له به ر ئه ده ب ئیر شـاد نا کاو هه رته نیـاخه ریکی خواپه رستی ئه بێ به ڕاسـتی له خزمـه ت حه زره تی شێخ (عـثمـان سراج الدّین ی طه وێڵه «قدس سره») و کوره کانی خۆشه ویست بووه زۆر به خشنده و میهره بان ومقتدر وبه ڕچاو فراوان وجوان خاس وسه خی طه بع بووه.
٢– مانی : ناوی، نه قڤاشێکی به ناوبانگ بووه.

به داوی زولفــه وه به ستی و ڕه قیـبی لێم خه به ر دارکرد
دوعام کرد چاوه که ت خۆشبێ که خۆشبو ئه منی بیمارکرد
ڕه فیــق ئامان دوعــاکه ن ڕه ببی ظــالم بێ ، به بیـماری

ئــه ر ێ ئه ی شۆخی شــیرینم کــه عاجزنی ئه دی بۆچی؟
له گه ڵ من مه یله که ت که م کرد و ڕوت لادا ئه دی بۆچی؟
تــوفه یلی دڵ به ده ســتی تۆ ده ناڵێـنێ ئـه دی بۆچــی؟
ئه گــه ر تۆ ڕاســت ده ڵێ ی وقاتڵی دڵ نی ئه دی بــۆچی؟
درۆزن تــیری موژ گانـت به خـوڕ خـوێن دێ له سـوفاری

ده رونم پڕ لــه زوخــاوه ده نــاڵم هــه روه کو مــه جـنون
نه ما صه بر وشــه کیبایيم ســه روماڵم لــه ده س درچــون
به تیر و تازیانه ی عه شــقی ئه و دڵــداره بــووم مه فتــون
وه کو فوواره که خوێن ده تکێ له گۆشه ی میحوه ری گه ردون
له چاوه ی چــاو ه کانی من لــه دوریت هێــنده خوێن باری

به مــیعماری غــه مــت وێـرانه که ی دڵ وا له ته ڕمــیم دا
ســه رو سامان وڕوحــی من له ژێر دوو ده ســتی ته سلیم دا
وه کو نوقته ی به یاضــی ڕوت له به یــنی حه لـقه یی میم دا
مونه جــجیم گۆشــه یی چاوتی که دی نوســی له ته قویم دا
کــه ئه مســاڵ ذو ذه نه ب طــالیع بووه ئیفســاده ئاســاری

## ﴿به قه د عه ر عه ر به ده م غونچه به باڵا سه روی جۆباری﴾(١)

به قه د عه ر عــه ر به ده م عــونچه به باڵا ســه روی جۆباری
بـه له نجـه و لاری پڕ نـازی به سـیحری چـاوی عه یـیاری
ســه رم سوڕما له حوسـنی ئه و که دیتـم ماهی ڕوخسـاری
کـه وا دارایی زه ڕ،کـورته کــه مه ر چـین،جوبـبه گوڵناری
کـڵاو لار چاو خومار شـیرین سـووار خاڵ مـیشکی تاتاری

هه مـوو نــه ققــاشی چـین عاجـزن بۆ ڕه نـگ وڕوی لاوت
هه موو به ند به ندی دڵ به نده به حه لقه ی زولفه که ی خاوت
وه کــو ته یرێـکـی بـێچاره ئـه من کــه وتومـه نێـو داوت
کــه مانی(٢) هاته سه رکێـشانی ئه برۆی تۆ له پـاش چاوت
له مه ستی ده ستی وا له غزی که که چ هات خه طی په ڕگاری

قه مه ر شێوه ی هیلالی گرت له شه رمی حوسنی سه رشارت
له گوڵ شه ن غونـچه ڕوزه ردما که بیـنی نوقـته که ی زارت
خـه یاڵی خـاوه ته شبـیهی به گـوڵ یانه قـشی ده سـکارت
گـوڵ ئه مڕۆ خۆی موقابـیل کرد له لای خه ڵقی به ڕوخسات
بــه لێ هـه رده م دڕا وو هــه رزه گــۆن مه حــبوبی بازاڕی

کـه شــه و دیتم له خه وما قامه تی ئه و ئـه منی بێـدار کرد
نـه ما چـــارم له پڕ دڵی به عه شــقی خۆی گرفـتار کـرد

# زامی دڵ[1]

بــه خوینــی ئاڵی چاوانم ده نووســم ده رد و زامــی دڵ
کــوژاوی تــیر و په یــکانم به دڵ بێــزاری زامــی دڵ

به نێزه ی نووکی مــوژگــانی برا واکون کــونه جه رگم
نموونه ی وێنــه یی سیــنه ، نه یــه ، بیــلێ به کامی دڵ

له ده س چوو ڕه ونه قی بازاڕی فیــکری بیکری ئه شعارم
بڵێم چی بێ ته ئه موول لێت ئه نووسێ، ده س، که لامی دڵ

برا به س سه ر زه نش که تو خووا وه عزم مه ده هه رده م
به یانــکه م باله عــاله م من ، پــه رێشــانی خیتامی دڵ

که ڕێگه ی مه شــقی عه شقم گرتووه ڕێــگای هیدایه تمه
که ئه و وای داوه فتــوا گــیانه بۆ ڕوتبه و مه قــامی دڵ

عه قیقی دڵ به نه قشــی ئه و له شــاری شــامی خووبانا
به میهری موهری حه ککاکی ئه زه ل که ندوویه جامی دڵ

له بازاری ئه له ســتا ڕوحه که م مه ڕهونی عــه هدی کرد
هــه تا لێره ببیــسم مــن به کامــی دڵ پــه یــامی دڵ

له مه کته بخانه که ی عه شقا هه موو ڕێگه ی فه ناطه ی بوو
له گــوڵزاری به قادا هاته دی ئۆخــه ی وه لامــی دڵ

ده ڵێم ئه ی خوســره وی خــوبان مه ده ئازاری دڵ زارم
ده لــێ عوســمانی بێــچاره دڵم بــردووی به کــامی دڵ

---

١-ئه م هۆنراوه یه له دیوانی پێشو دا به ناته واوی وهه ڵه بڵاو کراوه ته وه هه ر چه نده ڕاستیه کـه ی کاتێك که وته به رده ست که ئه م دیوانه ش چاپ کـرابو بۆیه نه مانتوانی له شوێنی خۆیدا چاپی بکه ین داوای لێ بوردن ده که ین.

# ﴿ نیازی دل ﴾(١)

له هـــه ر لایێ دڵێ زاره ئـه وه دڵبـه ر شـــکاری کـرد
بڵـــێن به و تـاقه نازاره لـه به رچـی بوکـه قـاری کرد

ئه گه ر باوه ڕ ده که ی عومرم هه موو سه رفی فیراقی کرد
هه موو کارم به ضـــایع چـوو فه له ك بۆئـێمه یاری کرد

بڵێم چـــی هـیجری ئێوه م داغی ســه ردڵ بوو له ناکاوا
ئه جه ل هات وده ستی گرتم که چی ی بوو ده ردی کاری کرد ؟

ســه رو ماڵ ودڵ و گیانم فیـدای ئـه و شـاهی ده ورانه
بڵـێ به وشـاهه بـێ باکـه که وا ڕوحم نیـسـاری کرد

به سۆزی داغی هیـجرانی په یاپـه ی په ی کرا جـه رگم
به کووره ی ئاوری سیـنه، دڵـم مـه یلی هــه واری کرد

بـه جورعــه ی باده یی جامی له باله ب نۆشـــی یـــارانم
وه هـا شێواو و حـه یرانم کـــه هۆشـم ڕۆیی باری کرد

عه لاجـم ناکرێ گـیانه له ده س ئـــه م ده ردو ئـازاره
به تیری تازه پـه یکانی له سیـــنه م خوێنــی جاری کرد

به جـــه ور و جادوو وسـیحر و عه یاری وا دڵـی بردم
حه واله ی تیغی ته نویمی مــوژه و چـاوی خوماری کرد

قه رارم داوه من عوسـمان نه که م ته رکی وه فاو مه یـلی
که ئه و طیفلی دڵی برد فێـری شـــه هدی لێوو زاری کرد

***

١ــ ئه م هۆنراوه یه هه رچه ند له چاپی پێشودا بڵاو کراوه ته وه به ڵام به هه ڵه وه کاتێك که که وته به رده ست دیوانه که له ژێر چاپدا بوو بۆیه داوای لێ بوردن ده کـه ین که نه مانتوانی له جێگای خۆیدا بڵاوی بکه ینه وه.

زیکری تۆم نه گـرد زه ڕاتی وجوود
یا هـوو مه کێشۆ یا حه ی یا مه وجوود

دینـــم دینـــی تـــۆن وه ژیـانه وه
وه دیـــده نـــی ڕووت وه ئیـما نه وه

قه ســـری بێ قســـوور ته لاری دڵان
ڕازیـــان وه ناز ســـومبول و ڕه یحان

له تیـفه ی ڕوح و خه فی و ئه خفا و سڕ
عـه ترو عه بـیری حوبـبی ڕوح و بیڕ

ته شریف فه رما به ر چون هه رده جاران
وه شـوعلـه نمـای دڵـه ی دڵـداران

ڕوح ئـه ر قابـیل بۆ کـه ردم قـوربانت
نـووری دیـده و دڵ نـه ڕای فه رمانت

ڕوح په روازش که رد په ی فه نای ئه ته م
«عـــلّم الاسـماء اصـم وابـــکم»

زه لـــیل و زگـار شه رمه نده و حه زین
مه ســـیرم وه تۆن شای « قاب قوسین»

عوســـمان ئومیـدش نه «یوم المیعاد»
به ئیـعجازی تۆن « شـافع العـباد»

***

# ﴿ سه روه ری که ونه ین قیبله که ی دینم ﴾[١]

سه روه ری که ونه ین قیبله که ی دینم
دڵ وه یادی تۆن ژیان و ژینم

دیده و دڵ پە ڕێت که یلی شین نه بۆ
ڕوحێ نه حوزوور هام نشین نه بۆ

ئه و ڕوح ئاوێزان پای سێ داره بۆ
جه رگ و دڵ له ت له ت پای قه ناره بۆ

دڵێ نه خه یاڵ عه شقی تۆ دوور بۆ
چه نووری چه مان کوێرو بێ نوور بۆ

ئه و دڵ سوچیای ناری حه ریق بۆ
چه نی کۆی زووخاڵ وه هام ڕه فیق بۆ

ته وافم پایه ی ئاسانه که ی تۆن
مایه ی نه جاتی قیبامه ت وه تۆن

ته وافم مه حوی ده وره ی سایه ته ن
گیان قه زا گه ردان سایه و پایه ته ن

حه جم نه فه نای عه شقی سه وداته ن
سه ڵاتم ئه دای زیکری باڵاته ن

ژیانم نه تۆی گه ردی پاڵاته ن
نمازم نیاز زیکر و سه ڵاته ن

ئازای ئه ندامم وه زیکرت پڕ نوور
نه سایه ی عه شقت بیم وه نووری توور

---

١ – حه زره تي شێخ به و هۆنراوه ڕازاوه جوانه هه ستی نازك و ڕازي دڵی خۆی له خزمه ت حه زره تی ڕه سولی ئه کره م (ص) ده ر ده برێ. ١٩٩٤/٢/٢٥ ئه ستانبول.

## ﴿ده سم به رد قه ڵه م چه نی له رزه ی دڵ﴾(١)

ده سم به رد قه ڵه م چه نی له رزه ی دڵ
هۆرقوڵیان نه چه م هوونی جه رگ و دڵ

ده س و دڵ نه داخ ده رده که ی دووری
مه نویسان وه هوون سرڕی مه هجووری

سه د هه زار ده فته ر ده ردی مه هجوری
ئه ربه و بنووسووش نی یه ن سه بووری

سه بووریم ته نها دیداری ڕووته ن
شنه وایی گۆش وه گوفتوگۆته ن

حه یات په ی دووریت «کالمیّت» که وته ن
ما چی سوته کۆی کۆته ن و که وته ن

باقیش حه واڵه ی دڵه ی تۆم کامه ن
دڵ ئاوینه ی دڵ مه شهووری عامه ن

لوقمان ئاماوه وه ئه مره که ی تۆ
ده خیله ن ئاخر نه بۆ ڕه نجه ڕۆ

نه واچی عوسمان لو قمانش بێزیان
ئه ولادت لای من چون ڕوحه ن چون گیان

***

١ـ حه زره تي شێخ فه رمووی کاتێك ئه م هه ڵبه سته م به خه یاڵا هات و نوسیم بۆمه ولانای برام دوای ماوه یه ك نامه یه کی بۆ ناردم داوای ئه و مه به سته ی ده کرد که من له هۆنراوه که دا باسم کرد بو منیش وه ك وه ڵامی نامه که له گه ڵ لوقمان دا بۆم نارد

# ﴿صه فا گیان نامه ی شیرینت یاوا﴾(۱)

صـــه فا گیـــان نـــامـــه ی شـیریـنـت یـــاوا
که شـــو کۆی ســـه رسـه خت هیجران شکاوا

شـــکاوا کـــۆ کـــۆی ده رده کـــه ی دووری
دڵ که رد وه باخـــچه ی گوڵ غونچه ی جوری

دیدار ئـــه رمـــانـــا ته ی کـــه رده ن دووری
صـــه فـــاش دا وه دڵ جـیلوه ی ســـروری

دڵـــــت ئـــــاوا بۆ ئـــاوا بـــی دڵـــم
باخچه ســـه راکـــه ی خانـــای بوڵ بوڵم

بیـــم وه نـــه غـــمه خـــوان چه نی بوڵـــبوڵان
دڵ بی وه باخـــچه ی پڕ خـونچه ی گـــوڵان

جـــه لادا وه جـــام جـــان نومـــای جـــانـــان
ســـه فـــحه ی ئا ئینه ش شـــوعله هۆرشـــانان

تـــه م و ته مـــه لوول هـــه ناســـه ی خـــه مین
ئاتـــه ش ئه فشان که رد نه سینه ی خـــومین

مـــه ولـه وی ئاســـــان نـــه زمـی ڕه نگـــینم
چوون خه زنه ی ده روون کـــۆ کۆی ڕه نگینم

عوســـمان که لامـــت نـــه قشـــی نه قشـــی وار
جـــه واهـــیر دانـــه ی یـــاقـــوت و مـــروار

۲– بۆ وه ڵامی نامه ی شێخ صفاء الدین ئامۆزای ئه م هۆنراوه ی نووسیوه

# ﴿مه ولام هیجرانت شكاوان ئه عزام﴾(١)

مــه ولام هیــجرانــت شـكاوان ئــه عــزام
ئــه عــزام پڕنــه ده رد په ی نــامــه و نزام

نامــه و نزای ده رد دوریــت بێ حـه دده ن
په نجه ش نه حه یات جه رگ ودڵ به نده ن

ضــه ڕبه تــی دوریت دان له فه رقی ســه ر
مــه گه ر وه دیــدار غه م به رشۆ نه سه ر

مــه لــه رزۆ ئــه عــزام وه دار عه صــاوه
نه عره ی ســه ر ماچــی هاڕه ی ئاســاوه

چــون ئــاســاو پایــه ش بڵنــدو به رزه ن
نــه عره ته وگرمه ش ســه دهه زار ته رزه ن

ئا ســــاو چـــه نی من چ قابــیل دارۆ
ســه رنه هیــجری تـۆ ڕه عدو به رق مارۆ

مـــه ولام ئه رزانی بـه حــاڵی كــاكه ت
چــاك چاك مه كه ری نه وه رت چاكه ت

---

١– بۆ شێخ مه ولانای برای نوسیوه ١٩٩٥/٢/٢٥

نه ڕۆ شنایی هۆش نه بینایی چه م
مات و حه سره ت مه ند ئه صه م وئه بکه م

مه ر وینو جه مال شیرینت بێ غه م
به یۆ نه جای وێش گۆش وهۆش وچه م

صه بر وصه بوریم دیدارت مارۆ
ساخوواکه ی بۆ سه وای یا ئارۆ

عوسمان دڵ نه غه م دوری تۆ که یله ن
جه شادی و فه ڕج دونیا بێ مه یله ن

***

## ﴿دڵ نه گه شت وگێڵ سارای ماته مین﴾

دڵ نه گـه شـت وگێڵ سـارای ما ته مین
مـه دهۆش وسـه رسـام خه مبار وخه مین
سـه ر نـه گـێژ ولول لـوره ی بایـێوه ن
فـکرم ڕێـویـان هـۆشـم هـالیـوه ن
فکـر و هـۆش وحـاڵ خـه یاڵی وه یله ن
وێڵ وئـاراگـێڵ نـه کـۆی دوجـه یله ن
ته رکـی که ش و کۆ دوو ڕوه و کۆسـاڵان
وامـه نـده وحـه زین گردشـی وه تاڵان
فـکری کۆسـاڵان زیـکـری عـه وداڵان
مـه شـۆ جـه یادم شـه وو ڕۆو سـاڵان
وه شـی واده ت شی تاکه ی هه وای سه یر
یاڕه ب تـه و به بـۆ په ی نه جات وخه یر
دڵ پڕ نه غـه فلّه ت سـه ر نه هـۆشی خام
وه یـلان وحـه زین بێ ویروسـه رسـام
عوسـمان روزه ردو سه ر ئه ڤگه نده نی
بـێ زادو تۆشـه وخـه جیل مـه نده نی

***

## ﴿ دوریت نمازۆ دییه م شۆ نه خه و ﴾(1)

دوریت نمازۆ دییه م شۆ نه خه و
به ڵ وه خاو وینۆت شه و نه خاوی شه و

هێند خام خه یاڵان ماوه رۆم نه سه ر
سه ر وه نه م شێویان سه ر نارو وه به ر

شا که لی دوریت ڕای دیدار به سته ن
کلێله ی فیراق وه سه رکه ل وه سته ن

ڕای ئاماو لسوای وه رواوان گرته ن
وه هه ناسانی سه رد یه خ به ندان که رده ن

لافاوی چه مه ی چه مانم چمان
دوو ڕودی دووڕون وه تافگه ی خه مان

قه ڵوه زه ش چه نی ڕه شه بای هیجران
سه فینه ی سه برم غه رقه ن نه حیرمان

یا هه وری دوری وارانی ویصاڵ
وارۆ نه دیده م، هۆرکه رۆ شه ماڵ

وه ئولفه ت به زمی ڕه ندانی ڕای حه ق
وه سرڕی حه لقه ی مه ستان « انا الحق »

وه سرڕی سه فای نه شه و بێداران
وه زینده دڵی عه ودالّ عه و د الآن

وه شوکرو سه بری ڕیازه ت کێشان
وه ئاهو ، یا هوی ناڵه ی دڵ ڕێشان

پاڕه و لاڵه ی من جه حه یی مبین
وه نزا و ناڵه ی چه مان پڕنه شین

زوو به زوو دیده م وه دیدار شاد بۆ
ده ردی هیجرانان ته مام به رباد بۆ

عوسمان عه شقی حه ق نه ڕوح دڵبه نده ن
پڕ شۆر و سۆزه ن تا حه یات مه نده ن

---

1- بۆ شێخ مه ولانای برای نووسیوه

# ﴿ میرزام سوواریٚ ، میرزام سوواریٚ ﴾(١)

میــرزام ســوواریٚ ، مــیـرزام ســوواریٚ
ئــه رمـانا ویٚنــه ی شــۆڕه ســـوواریٚ

ســــوورای مــیران ، چــاپوك تــه واریٚ
نه دیـــه نم ویٚــنه ش ســالار ســوواریٚ

ئاما نــه مــه یـدان وه ده وانـــی ده و
چـون به ڕقی خـاطیف نه یازیك نه شــه و

ویٚنه ی مـن وه ی تــه ور وه ی ڕوخساره وه
ژوولـیای شـیٚوه ی هــیجران بــاره وه

ئــانه ڕازیـــای گـــونا بـاریٚــوه ن
مـه ڕیاوه ی هه یــکه ل شاسوواریٚوه ن

نــه داخ و دونــیی چــه رخی چه بی واز
حــه یات وامه نــده ن پیٚش نه مه ن نیاز

بدیه وه جــه ســته م ســـواره ن نه زین
لا شــه ی بیٚ ڕوحــه ن چه مان پڕ نه شین

ئه سپی خه م وه کۆڵ خه م وه نه ش باره ن
وه یــلانه ن دونــیا نــه دیده ش تــاره ن

---

١ـ حه زره‌تی شیٚخ عوسمان سراج الدین له حجازا به ر له وه بگاته مه دینه ی مونه وه ره به و هۆنراوه یه هه ستی خۆی ده ر بڕیوه له خزمه ت حه زره تی ڕه سولی ئه کرم ﷺ هه رچه نده له دیوانی پیٚشودا بلاّو کرابۆوه به لاّم له به ر ئه وه ی ناته واو بو وه ئیٚستاش به ته واوی که وته به رده ست بۆیه دوو باره بلاّومان کرده وه..

پورتـــافش نـــه چــــه م بـــاو بۆرانیۆه ن
ئـــانـــه داخ نـــه دڵ تـــاقـــه یـــاریۆه ن

چـــمان نه عـــه رســـه ی داغ داریـــوه ن
گه ردشـــی چوڵ گه رد تاکه ســـواریۆه ن

بـێ قـــه رار نه دڵ دڵ ئـــارامیـــــوه ن
دڵـــه ی شـــــارویران دڵ ســه ر سامیوه ن

عاشـق وه شوعـــله ی بوراق ســـواریۆه ن
گه رده ن مینـــای ساف چون مرواریۆه ن

قـــه ڵه م زووانـــش لاڵ بـو چـــه م لـــیلاو
مـــروار چ لایـــق عــــه ترش بۆی گوڵاو

ســـیروانی ســـه رئـــاو هووناوی دڵـــه ن
تاڤگه که ی بێ په ی چه مه ی قوڵ قوڵـــه ن

نـــه داخی هـــیجران باڵای بێ گـــه رده ن
چه م که یلی هوناو چل چه مه ی هـه رده ن

بـه حری ئه حمه ره ن فووار ه ی چه مه ن
چـــه مانم چـــمای ده ریـای بێ په یه ن

ئه و ئه سپی سه رکه ش جیهان په یمای ره ی
هانه گێج و مـــه وج به حره که ی بێ په ی

ئـــه و ســـا نه سارا بادی یـــه پـــه یما
ئیســـته به حری یه ن نه مه وجـی ده ریا

ده ریا تـــه ی کـــه رۆ شـــه و بـێ موداران
ره وان و ده وان کــــــه ش و کۆســـاران

جه ده شت و سه حرا به یۆڵ غار پرتاف
نـــه که شـــتی بێ باك نه فه رته نه و تاف

تــه ی کــه رۆ هــه وا تــه یاره نــه جه و
مــوداران نه بــۆ نــه بــه رۆ نــه شــه و
شــوکره ن نزیکه ن دڵ شادبۆ وه دۆس
چه نی خواوه ند مه ئنوسه ن ئه و دۆس

شــوکــره ن دییــانی وه مــه دینــه شار
شــاری پڕ جــه نــور بورکــانی ئــه نوار
شــوعله کــه ی دیــدار کــاره بــای دڵان
مــوناره ی مــه دار قوتــی ڕوح وگــیان

بــورکــانی ئــه نــوار مــوناره ی والا
شــوعــله ئه فشان بی نه عه ڕشی ئــه علا
مــوناره ی مــه دار گۆشــه واره ی عه ڕش
سه ما و سه رزه مین په یش بییه ن وه فه ڕش

دیــاری دا مــه کان جای مه لائیــکان
مه لا یك گردین صه ف صه ف مه پێکان
منیــچ چون ته شــنه ی گوڵســانی بۆستان
ئــاواتم قــه ترێك جــه مــای به رده ســتان

نه قاپیت نۆ شــو فــه یزی کــه وســه ر وار
که وسه ر کام که وسه ر چل چه مه ی ئه نوار
دڵ نایــیل وه فــه یز گــه ردی پای پــاکش
زیــاره تی ڕه وضــه و شــوباکی تاکــش

ڕوحــم وه فیــدای گــه ردی پاڵاکه ش
ســه رگه ردی بــاڵای ئــاڵاو واڵاکــه ش
حــه یات و مه مــات حه زره ت مساوی
شــاهید په ی حــه یات ئایه ي سه ماوی

گه وهه ری ده ریا و  ده ریای گه وهه ره ن
جه وهه ری جه وهه ر  گردین جه وهه ره ن

دووبـاره (صـلوات)  وه ڕوحـی  پاکش
سـه د هه زار میـلیار وه  جه سته ی تاکش

جه حه د و  ئه وده ر  جه  علیمی به شه ر
بارۆش  بێ حیـسـاب  خـواوه ند فێشته ر

نه سیمه ی زولفه یـن ڕایـحه ی گـوڵاو
وه خاك  و پـاش بۆ سـه د هـه زار سڵاو

وه نه وشه ی  وه ش  بۆ  ڕه یحان  لاره مل
نه سرین  و  سۆسه ن  خه جڵانه ن سومبول

(صلوات وسلام)چون ڕشته ی گه وهه ر
جـه واهیر به ندان سـه د هه زار ئه و ده ر

له سه ر ئه و  زاته  حه ق  فه رموی (دنا)
ملء السـموات والعـرش الاعـلى

عوسـمان نه قاپـیت ئه سـیرو حه زین
ئومێـدش وه تـۆن خـیر المرسـلین

***

# ﴿تاکەی بناڵون نە دەردی دووری﴾[1]

تاکەی بناڵون نە دەردی دووری
تاکەی وە دیدار نە دۆم سەبوری
دووریت ژار مار گەستەن مەزاقم
شەوان ئالودەی دەردی فیراقم
ناڵەم چون ناڵەی تاق تاقن نە تاق
پایانش نیا دەردەکەی فیراق
فیراقت وە دەرد فیراق بەرباد بۆ
وەی شێوەی شیرین من دڵم شاد بۆ
هەرشەو تا سەحەر من ناڵام وە سۆز
سەحەر سفتەی کۆم با بەردەش چون تۆز
نەسەر تا وە پا وە ژار رازیان
هەرد و دۆڵ و کەش چەنەم بێزیان
تەپ و دوی دوکەڵ هەناسەی سەردم
تۆ ئامای لوای ساچیت نەبەردم
منت وست نە دام کورەی مەهجوری
بیم وە سفتەی کۆی حەریقی دووری
ئەسیر هیجران کۆی زو خاڵەنا
جە دووری خاڵان دڵ خاڵ خاڵە نا
پەی ئاماو لوای حەسرەت وەردە نا
عوسمان وە عوسمان دڵ پڕ دەردە نا

***

---

١– بۆ شێخ مەولانای برای نووسیوە لە تورکیادا.

## ﴿ یا خـوا گوڵ نـه ورۆز وه شار نه خێزۆ ﴾(١)

یا خـــوا گوڵ نــه ورۆز وه شـــار نه خێزۆ
مـــا باقــی گــوڵان بـــێ واده ڕیـــزۆ

گـــوڵان به ر نارۆ ئێــســاڵ کۆســـاڵان
تیـــپ نه دۆ ســـوپای خه یمه ی گوراڵان

چونــکه دڵه که ی من نیشته ن وه غه مناك
یا خــوا هــیچ گـــوڵێ به ر نه یۆ نه خاك

بـه ر نه یا نه خـــاك نه ســـور و نـــه زه رد
هـــه ریۆ نه جای وێش بان به تۆزو گه رد

هـــه راڵـــه برم ئه ســـرش نه جۆشـــه ن
پـــه رێ نـــازاران دڵ نـــه خرۆشـــه ن

هـــه را ڵـــه بـــرم مـــه گـــره وۆ وه زار
په رێـــو نازاران مـــه شـــوره ن نه شـــار

« تـــبارك الله » جـــه خـووای ئـــه کبه ر
فه ســڵی وه هاره ش که رده ن مونه ووه ر

وه گـــوڵ و گوڵزار ســـه وزی ومێـیرغوزار
ڕاز نـــۆش شـــیرین بـه گـــوڵ ولا له زار

هه وه ڵ ســـــه بیاران بـــه رمـــه یۆ نازار
مـــه بۆ وه جاســـوس گوڵانـــی وه هار

ســـه یـــاران ســـه بیار ده وری بـاڵاته ن
ســـه بیـــاره ی بـــه رزی ئـاڵ و واڵا ته ن

دووه م گوڵێ وه ن ساق سورمه ی وه نه وش
دڵـه ی دڵـــداران مـــاوه رۆ وه جـــۆش

سێ هه م گوڵێ وه ن ساق سورمه ی مایی
شـــیرین و وه ش بۆ ڕه شـــته ی ئـیلاهی

---

١– بۆ ده ر برینی هه ستی عه مو بێ تاقه تی ئه م هۆنراوه ی نه رموزه.

## تاك

**﴿ من به باغی مه حموود ئاوا وباغی به غا گه پ ئه که م ﴾(١)**

من به باغی مه حموود ئاوا وباغی به غا گه پ ئه که م
تـۆ به غه م خـواری شـڕۆڵه ی ماڵی مه روانم ده که ی

***

## تاك

**﴿ نامه پشت گوێ نامه که ی حه لقه ی زه ڕینی خامه که ت ﴾(٢)**

نامه پشت گوێ نامه که ی حه لقه ی زه ڕینی خامه که ت
بـــۆ نیـــشانه ی عیشـــقی تۆ نـــاوم نراوه نامـــه که ت

***

## تاك

**﴿ نه و نه هالی باغی عوسمان بۆ چراغی دینه که م ﴾(٣)**

نه و نـــه هـــالی باغی عوســـمان بۆ چـــراغی دینـــه کـــه م
نووری دیده م رۆیی بردی نووری هه ردوو دیـده که م

***

## تاك

مـوطریب ونه ی چی و سه ماوه ر وا به جارێ حازرن(٤)
تا غـــه نی بێته موغه ننی به زموو ڕه زمی بێ نه به رد

---

١ – وه ڵامی یه کێ که که باسی موڵکێکی حه زره تی شێخی کردبوو له مه ریوان
٢– بۆ عوسمان ناوێکی نووسیوه
٣– به بۆنه ی کۆچی دوایی شێخ محمدی کوڕی حه زره تی شێخ جه نابی مه لیك محمود بۆ سه ره خۆشی ئه و فه رده ی ناردووه
٤– ئه سبابی به ننایی ئاماده کرابو وناردبویان به شوێن وه ستا غه نی به نادا که بێت ئیش بکا منیش ئه م تاکه شعره م نوسی

چــواره م گوڵێ وه ن شـیرین گاو گوراڵ
نازك ونــه جیب شــیرین شــیرهــه راڵ

عــه تر ئه فشــانی وه نه وشـه ی وه ش بۆ
دڵـــه ی غــه مــینم قوڵ مــه دۆپــه ی تۆ

وه نه و شه ی وه ش بۆکه چ که رده ن گه رده ن
سـوجده ش وه میحراب ئه برۆی تۆ بـرده ن

ما باقی گـــوڵان ئـــاڵ وســـورو زه رد
مــه بان وه ســوکنای دڵه ی پر جــه ده رد

نــه واچــی دوره ن دوری بێ مـــه یله ن
به گیـانت قه ســه م ده رونم کــه یله ن

تا ئه وسات جه سته م مه شـۆ نه تۆی گڵ
عوسـمان یادی تۆش به رنه شـیه ن نه دڵ

***

## ﴿لا لۆی دانا مه ی وه فا په ر وه رده﴾ (١)

لا لــۆی دانا مه ی وه فــا په ر وه رده
ســوچیای ئیخلاس نه و هه ردو به رده

وه ته ل تــه له فــون داخوازی عــاله م
په ر سابێت جه حاڵ په ی حاڵی ناڵه م

مه پرســه جه حـــاڵ تــاڵی تاڵه کــه م
جه هیجری دۆسان ده ردو لا له کـه م

ئه سه د یانی شـێر شێرانـــه ده ســتور
گیره وه ر ڕای تورك په ی شــه وقی حوزور

پــه ی شــوناســایی بــه دڵ وعــه یــان
بـــه زیکر و فکـرو ناڵـه ی به ربــه یــان

عوسـمان ڕه جاشه ن به دڵ په ی دۆسان
گردین جــه مــع بان خوا شــوناســـان

١- حه زره تی شێخ له وه ڵامی نامه ی ئه سه د خانی ڕه زاوا فه رمویه تی له تورکیا له ساڵی ١٩٩٥.

چه ند پارچه غه زه ل و

هه ڵبه ستێك كه بۆ خزمه تی

حه زره تی پیر نوسراون له لایه ن

مریدو دۆ ست وخۆشه ویستانه وه

ته نها بۆ یادگاری و به جێ

گه یاندنی ئه ركی وه فا لێره دا

هه ندێك چاپ ده كه ین

## ﴿زێوه ری باخی حه قیقه ت شاهی عوسمانه به هه ق﴾(١)

زێوه ری باخی حه قیقه ت شاهی عوسمانه به هه ق
بولبولی شـاخه ی گـوڵی گوڵزاری عیرفانه به هه ق
مورغی بێ په روا په ڕه نده ی مێرغوزاری وحده ته
تایری خۆش ئاشـیانه ی بورجی کـه یـوانه به هه ق
دوڕ و مه رجانی ته ریقه ت جان و قه لبی مـه عریفه ت
شه معی جه معی به زمی حه لقه ی ئه هلـی بورهانه به هـه ق
حوسنی خولقی لوتف و نو تقی شـکڵ و شێوه ی شاهیدن
مـه زهـه ری نوری سـیفاتی زاتی ڕه حـمانه به هه ق
ئه وحه فیدی حه زره تی شێـخی « ضیاء الدین عمر»
نـوری چـاوی خـانه دانی ئالی عوسـمانه به هـه ق
حـه زره تی بابی ئه لێن ته حسـین نه که ین بێ فامی یه
ئه م وه کـو جۆگه ی ده لێن ئه و به حری عه ممانه به حه ق
ئه و چه موحتاجه به ته حسین گه ر بکه م ئه وسافی ئه و
وه سفی ئه م بۆ زاتی ئه و ئایات و بورهـانه بـه هه ق
من که ته حسینی سیفاتی پاك و نوتقی ئه و ده که م
تۆ به بێ شك ئه م بناسـه قوتبی ده ورانه به هه ق
بۆستانی مه عریفه ت باخی حـه قیقه ت هه ر ئه وه
ئه م وه کو یوسف ئه ویچ وه ك پیری که نعانه به حه ق
ئافـتابی عـاله مـه وا ڕووی جیـهانی گـرتـووه
زه ڕه یێـکی ئه م له ئه و شه مسی دره خشانه به حه ق

---

١– شیعری سید بهاء الدین ( شمس ) بۆ حه زره تی شێخ عوسمان سراجه الدین ی نووسیوه

ئـــە م مە هە و ئـــە و ئافتابە ئیقتـباسی نور دە کـــا
ئە و کــە کانی ڕە حـــمە تە ئە م قە ترە بارانە بە حە ق
ئە م بە ئە و جیـلوە ی جـە مالی دا کە خۆی زاهیر دە کا
ئە و لە بۆ شـــە معی جە مالی مسلی پە روانە بە حق
شێخ دە بێ کام بێ لە جادە ی شە رع مویێ کە چ نە بێ
پە یڕە وی قە ولی حە دیث و حوکمی قورئانە بە حـە ق
ئە و مورە وج بۆ شە ریعە ت هــە ر وە کو شێخی «ضیاء»
هـە ر کە تابع ئە و نــە وێ ئاخر پە شیمانە بە حە ق
ئە هلی علمی تابعە ، ئینکاری ئە و تۆ چۆن دە کە ی؟
ئیجتـــماعی عـــالمان خۆ دوور لە بوتـــلانە بە حـــە ق
پیری عە سر و شێـخی دە هر و مورشید و غە وسی زە مان
جێ نشینی شاهی نە قشی وغە وسی گە یلانە بە حە ق
خۆزگە بە و کە س وا بە حوبب و عیشقی ئە و دێوانە یە
ســە ر بلنـــدی عاقلانـــە دوور لە بوتلانــە بە حـــە ق
مورشیدی ڕێگە ی شە ریعە ت دە ست گیری ڕێ ی تە ریقە ت
پـیری دە روێشان و شـــێخی خـــە رقە پۆشانە بە حە ق
دە ردە داری ؟ ئـــە و تە بـیبی حـــازقە ماتڵ مــە بە
حیکمە تی حوکمی خووایە عە ینی لوقمانە بە حـە ق
حـــازقێکی وا عیـــلاجـــی دە ردی بێ دە رمـــان ئە کا
فکرو حوکـمی فە یلە ســوفان جو ملە حە یرانە بە حە ق
پیـــری پاکی گـــە ردو و تـۆزی عـالە می ناسـوتی یە
شیـێـــخی لاهوتی مە قامـــە شاهی شاهانە بە حـە ق
تـۆ بە زاهیر ئە و دە بیـــنی ، باطـین ئاگـــات لێ نـــی یە
ئە و لە وادی وە حـــدە تا مە شـغوڵی جە ولانە بە حە ق

ئه و له شاخی به رزه خی به رزی فه نا سه رکه وتووه
فارسی ده شتی به قایه مه ردی مه یدانه به حه ق

مه ستی باده ی به زمی جه زبه ی قورپی نه شئه ی فه ردیه ت
پیری سه رحه لقه نشینی باده نۆشانه به حه ق

(شمس) دائم ئینتزاری پو ڕته وی لووتفی ئه وه
تار و تاریکی غوباری گه ردی عیسیانه به حه ق

***

## ﴿پا كه تی شيرين مه فادی حه زره تی شاهانه هات﴾ (١)

پا كه تی شيرين مه فادی حه زره تی شاهانه هات
هه روه كو تووتی به كوڵێ قه نده وه مه ردانه هات

بۆ موباره ك بايی ئه م عه يش وسروور وعوشره ته
تايه فه ی ئاغاو و به گله ر، عه شره ت وبێگانه هات

جه معی ده روێش ومه لا وصۆفی له گه ڵ ئه هلی طه ريق
ساقيی و مه ينۆش ومه ست و مورشيدی مه يخانه هات

ده ف زه ن وشمشاڵ ژه ن وسه رپاكی ده نگ خۆشی ووڵات
شێت وسه رعی گێژ وغافڵ، عاقڵ وفه رزانه هات

سه ربه پرچ و ده س به زه رگ ، مل به ڕه شمارۆ به لێ
سه ف به سه ف ده م پڕ له ئاگر ، تاقمی دێوانه هات

پرچی ده روێش وچرا تێكه ڵ به يه ك بوو بوو به شه و
نورو (ظلمه) ت هاته پێش وبۆسه ما په روانه هات

به رخ ومێ ، هێ هێ ی به ران وكاوڕو شه ك بێ حيساب
قه ند به خه روار و خه رار و (دووبه ره) ی پڕشانه هات

سه د ژن و سه د پيره ژن دووسه دكچی نه رم ونيان
سه د منالی بێ كه س و كه سداری دوو ساڵانه هات

---

١ـ غه زه لی خووا لێ خۆش بوو كاكه حه مه ی (ناری) بۆ حه زره تی پير .
حه زره تی پير ته شريفی پيرۆزی ده چێ بۆ پێنجوێن له وێ ده بيستێ كه حه ڕه می كاكه حه مه ی (ناری) كۆچی دووايی كردووه هه رچه نده كاتی سه ره خۆشی به سه ر چووه وچوونی ئيترا نيش له و كاته دابۆ ئه و زاته نه ده گونجا به ڵام له به رخۆشه وستی كاكه حمه حه زی كردووه كه خۆی ته شريف به رێ بۆ ديده نی بۆيه وه ڵامی بۆ ئه نيرێ كه ديم بۆ مه ريوان بۆ ديده نيت . ناريش كه ئه وه ده بيستێ زۆر حه زده كاو ئه م غه زه له ی بۆ پێشوازی ده نێرێته خزمه تی .

سه د له جوو، یه ك سه د له ته رسا، سه د له ڕوهبانی مه جووس
سه د له گه وره ی بت په رست وساده ڕوومه ستانه هات
سه د قوتوو ئه نواعی عه تری ، سه دله شوشه ی پڕ گوڵاو
سه د چه پك خونچه و وه نه وشه ونێرکس و ڕه یحانه هات
موفتی بۆ فتوا به نه ی ، قازی له بۆ ته حلیلی مه ی
سه د موده ڕریس بۆ ئیبباحه ی به زمی ئه م مه یدانه هات
بوو به ڕۆژی جه ژن وشادی ، وه ك جلووسی پادشا
هاتی (ناری) بوو له سایه ی تۆ که وا ئا زا نه هات

***

## ﴿خه زانی هیجری تۆ بوو ئه ی ئه ساسی عیززو ته مکینم﴾ (١)

خه زانی هیجری تۆ بوو ئه ی ئه ساسی عیززو ته مکینم
شکستی دا به باغاتی خه یاڵی قه لبی غه مگینم
نه ما ته رتیبی ئه لفاظ و مه عانی بۆ که لامی من
ده سا چی بکه م له باغی فکری بێ ئا سارو په ڕژینم
غه زه ل باوی نه ما بێ مو شته ری ما هه ر وه کو ته قوا
به سه ر چوو ڕه ونه قی بازاڕی نه ظمی شۆخ و ڕه نگینم
به غه یره ز تۆ نه بێ، ئه ی خوسره وی موڵکی مه عانی کێ
ده مێ بێتو ته ماشاکا له شێوه ی شیعری شیرینم
که لامم خاڵی یه وه ك مه نجه ڵی ماڵی مه لا ئیمڕۆ
له پێخۆری مه عانی بۆیه وا بێ وه زع و ته حسینم
بلووری دڵ شکا وه ك جامی ، مه ی فکرم ڕژا وه ك مه ی
نیشانه ی دڵ شکا ویمه ، سروشکی ئاڵی خوێنینم

موریدی عه شــقــی توٚ گرتوویه توٚ بوٚ زیــکری تــوٚ بیٚ توٚ
دووسه د ته سبیحی سه د دانه له دانه ی له علی ئه ســرینم

به یادی له ززه تی هـــه نجیر و شـه هدی لوتف و ئه لطافت
خه ریکی حیفظی ســوره ی (نه حل) م وئایاتی (والتین)م

مـــــه لا ئاماده بیٚ وا چـــاکه هـــه روه خـــتیٚ له باڵیــنم
ئه ســیری هیجری توٚم وهه ر نه فه س موحـــتاجی یاسینم

له حه لقه ی فه وجی ده ر بانی عـه لائه ددینی عوسـمانی
قبــووڵـــی خاتـــری پاکـــی (ضـیاء الحـق والـــدین)م

به شه رتیٚ ده وڵه تی لوطفت حه واڵه ی حاڵی (ناری) بیٚ
به دڵ بیٚ باك و موســته غــنی له موڵکی چین و ما چینم

***

١ـ کاکه حه مـه (ناری)و حاجی بابا شیٚخ و مه لاعه زیزی پاوه ی وحه مه پاوه یی و جه ماعه تیٚکی زوٚر ده چن بوٚ دووڕووه بـوٚ زیاره تی حـــه زره تـی پیــر دوای چه ند ڕوٚژ مـــانه وه له دوا ڕوٚژ دا حـــه زیـان له نان و خـواردنی ناوباغ ئه بیٚ حـه زره تی پیر ده سـتور ئه فه رمـوویٚ خـواردنیـان بوٚ ئه بـه ن بوٚ ناوباغ. له گـه ڵ خـواردنه که هه نگونیشـیان بوٚ ئه نیٚریٚ وکاتیٚك خـوٚیشی ته شریف ئه با بوٚ لایان هه نجیریان بوٚ ئه با کـه (ناری) هه نگوین وهه نجیـر ئه بینیٚ دوای گه ڕانه وه ی ئه م غه زه له ئه نوسیٚ و به (سیـد بابه شیٚخ) دا ئه ی نیٚریٚ بوٚ خزمه تی حه زره تی پیر وئه م تاکه ش له سه ر زه رفی نامه که ئه نوسیٚ.

حامیلی ئه م عه رزه سه یید بابه شیٚخه و که س نی یه
حیفظی ئه سراری نیهانی ده ئبی هه ر ناکه س نی یه

## ﴿گه رچی ته قصیری نه هاتن کاری به ندی قاچمه﴾(١)

گـه رچـی تـه قصیری نـه هاتـن کـاری به نـدی قاچـمه
ده م بـه ده م داوێنـی پاکـت ، پاکی جـێگـه ی مـاچمه
دوور له تۆ ، ساعه ت به ساعه ت ، وه ك نه خۆشی بێ طه بیب
چـاوه ڕێـی ئـاوازی ده نـگی خـاکه نـازو پاچـمه

***

## ﴿چون خه یاڵی گوڵ به پایز خاوه نایه دێمه وه﴾(٢)

چون خه یاڵی گوڵ به پایز خاوه نـایه دێمه وه
هـاتم و وا ڕۆیمۆ ئه پیامی گـوڵ بـێ دێمه وه

***

---

١– حه زره تی شێخ حه ز به چاو پێکه وتنی (ناری) ئه کا و ئه نێری به شوێنیا که ئه گه ر بۆی بکرێ بێ بۆ خـزمه تی بـۆ دووڕووه به ڵام وا دیاره ناری له و کـا ته دا له به ر ناسـاغی نه ی توانیـوه بچێتـه خزمـه تیـان و ئه و چوارینه ی کردۆته دیاری و عه رزوحاڵ و هۆی نه هاتنی .
٢– له وه رزی پایزا (ناری) ئـه چێ بۆ دووڕوه بۆ زیاره تی حـه زره تـی پیر به ڵام ئه و زاته له و کـاته دا له (ژنین) ده بێ کـه خه به ر ده بیستێ گـورج ده گه ڕێته وه بۆ دووڕووه به ڵام (ناری) ئه م تاکـه ی به جێ هێشتووه و ڕۆیشتووه.

## ﴿ بابە گـیانم گیانی شـیرین دائیما قـوربان ئه كه م ﴾

بابە گـیانم گـیانی شـیرین دائیـما قـوربان ئه کـه م
رِوح و گیـان ومـاڵه کـه م قوربانی شاعوسـمان ئه كه م
دور له تۆ دائیـم ده نا ڵـم وه ك نه خۆشـی بێ (طبیب)
بۆشــه رِفیابی حـوزورت شۆرِشی مه سـتان ئه كه م
ســه روه را بێزاروزارم من لـــه دوریت شـین ئه کـه م
به س به وه صل ومیهری تۆمن لێوه كه م خه ندان ئه كه م
پـرِ لــه ئا هــو حه سـره ته دائـیم دڵه ی بیـماری مـن
بۆنــه هــاتي هــاتـنم من دیــده پرِ گـریان ئه کــه م
دڵ وه کــوهــه وری بــه هــاری نــاڵه وو هـــاوارییه
من به بێ تۆ کـه ی خه یاڵی شـادیی وسـه یران ئه كه م
چـــاوه رِوانــی مــه قده می تۆیه دڵـه ی وێڵـی ووڵات
خۆزگه ئه مدی ئه وده مه رِێگه ت گوڵ ورِه یحان ئه كه م
هیـمــــمـه تی پـیرانه تــم ئاواتــه بـۆ کامـی ده رون
بۆ یه دائـیم چـاوه رِوانی فرصــه ت وده رمان ئـه كه م
گه رچی دورم مــن له دیدارت به دیــدارت قه ســه م
رِۆژوشه و رِوحم له لاته خـۆ به سه ر گه ردان ئه كه م
دور له تۆ بـێ تۆ حه رامه هه رچی مـاوه ژینــه کــه م
من به بـێ تۆ پـشت له حوسنی حوری وغیلمان ئه كه م
صیحه ت وعــومــری درێژت شاهه کــه م ئـا واتمه
من له قاپی (حق) ته مه ننای عومری زۆر وجوان ئه كه م
ساخودا بیکا نه بێ سـایه ت له سه رئه م خـه ڵکه که م
وامنیش قوربان له سایه ت شوکری خوای رِه حمان ئه كه م

* * *

---

١ـ شێخ عبد الملك كورِي حه زره تی پیر بۆ ئیشتیاقي دیدار ئه م غه زه له ی ناردۆته خزمه ت باوکی.